# ستایش

شیعر

نەزەند بەگیخانی



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی



زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

***

ناوونیشان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی خانزاد، هەولێر

س. پ. ژمارە: ١

www.araspublisher.com

# ستایش

## شیعر

## نەزەند بەگیخانی



ناوی کتێب: ستایش
شیعر: نەزەند بەگیخانی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٢٥٨
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد
دەرهێنانی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم ، هەولێر- ٢٠٠٤
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (١٥٦)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

پێشکەشە بە
تۆ
نووسیبووت
هێفایستۆس بە هەردوو عاشقەکەی وت
چیتان دەوێ؟
وتیان دووین
دەمانەوێ ببین
بە یەک
منیش لە ناوقەدی با ئەمەم هەڵکەند:
عەشق
ئەو فەزا نارنجییە
سەر باڵەکانمی شین شین کرد
بۆ هەڵفڕین بەناویدا
نەک بتوێمەوە من تیایدا
ئەوەبوو
فەلسەفەی جیاوازیی من و تۆ

# دوعاکانی دایکم

پێشکەشە بەدایکم، ئەو مرۆڤە مەزنەی
فێری وانە ئینسانییەکانی کردم و تا
ئێستاش گەورەترین مامۆستامە

جگەرەیەک داگیرسێنە
چرایەک هەڵکە
وەرە با پێکەوە گۆرانی بڵێین
ئەی هاوڕێم
وەرە با پێکەوە سەما بکەین
بۆ هێورکردنەوەی دڵی حاجیلەکان
بۆ لاواندنەوەی دوعا تەنهاکانی دایکم



دایکم هەموو بەیانییەک دوعا دەکات
لەجیاتی دوو رکات شەش رکات نوێژ دەکات
دوعا دەکات بۆ رەوینەوەی رەشایی باڵی با
تاریکیی دەستی سیاسییەکان

هاوڕێم
وەرە با پێکەوە گوێ لە دوعاکانی دایکم بگرین
وەرە سەیرکە چۆن فوو بەدەوری خۆیدا دەکات و
لە فڕین دەپارێتەوە
کوڕە بچکۆڵەکەی ئاودیوی سنووران بکات
هانا بۆ نەسیم دەبات
تا کچەکەی هەڵگرێ و
دووری خاتەوە لە چڕنووکی قەڵەڕەش

وەرە ئەی هاوڕێم
وەرە با پێکەوە پێکێ بنۆشین و
بەسەر بانیژە بەرزەکانی وڵاتدا بفڕین
با ئیتر لە بەرزاییەوە فڕین بناسین و
لە نزماییەوە پەیژەی کەوتن هەڵدێرین

دایکم شەش رکات نوێژی کرد
شەش جار گریا و شەش جار دوعای کرد
ئاواتەکانی دایکم وەک مرواری سپین
لە ژێر سێبەری ئیماندا دەبریسکێنەوە





ئاواتەکانی دایکم پێ دەگرن
بەسەر پەیژە باریکەکانی حەوشە
سەر دەکەونە سەر کەپرەکان
لەوێوە لە جیاتی شەقەی باڵ
وەک هەڵاڵە هەڵدەوەرنە ناو حەوزەکان

دایکم هەموو بەیانییەک
شەش رکات نوێژ دەکات
شەش جار دەگریا و
شەش جار فوو بەدەوری خۆیدا دەکات
ئەو لە خوا دەپاڕێتەوە سەلامەت بن باڵندەکان
دوور بن لە بەڵای ناگەهان
لە فیتنەی ئاخری زەمان
دوعاکانی دایکم پیر بوون
پیر بوون ئومێدە ئاڵەکانی دایکم
بۆ فڕین بەناو وەرزەکان و
شۆڕبوونەوە بۆ ناو مێرگی حاجیلە و
گەڕانەوە بۆ ناو کۆشی نیشتمان

وەرە ئەی هاوڕێم
وەرە با پێکەوە سەما بکەین
ئیتر ئێمە دەزانین زەمەنی دوعا بەسەرچوو
فڕین باڵەکانی دڕاو و
با لێوەکانی وشک و
خۆر کەزییەکانی بڕاو و



باران پەنجەکانی سووتاو و
باخچە بیرەوەرییەکانی زەرد بوون
ئیتر من و تۆ دەزانین
زەمەنی دوعا تێپەڕی
هەروا بەسانایی
باڵندەکان داباڕین
پەیژەکان لەهۆش خۆ چوون
ئیتر من و تۆ دەزانین
ئەی هاوڕێم
زەمەنی سەرکەوتن رما
ئیتر هیچ شتێ داد نادا
مەگەر گۆرانی و شێت بوون و سەما

بەرماڵەکەی دایکم رەنگی ئاسمانی گرتووە
دوعاکانی رەنگی خەزان
باخچەکەمان ماندوو
پەپوولەکان تا لێهاتوو
ئیتر زەمەنی رزگاربوون نەما
زەمەی دوعا بەسەرچوو

وەرە ئەی هاوڕێم وەرە
ئیدی با پێکەوە کەپرێ لە تەنهایی و
سێبەرێ لە رووناکی داڕێژین
بەدەم سەمای قەرەجانەوە





شێت بوونی خۆمان ڕەنگ کەین و
پەیژەکان بەسەر بانیژەکان هەڵواسینەوە

وەرە ئەی هاوڕێم
وەرە با پێکەوە تۆو لە دوعاکانی دایکم بگرینەوە
وەرە با تۆوی دوعا بنێژین
لەبن بنجی وەنەوشە و مێرگی بەیبوون
بەڵکو بەیانیان پەپوولەکان پیاسەی پیادا بکەن و
هەنگ نیازیان لەبەر بگرێتەوە
ئەمە زەمەنی غەدر و پێشبینی نەکردنە
ئەی هاوڕێم

هیچ شتێ دادی دایکم نادا
تەنها ترووسکەی هیوایەک نەبێ
هیوای زیندووبوونەوە لە مردن
ئەو خەون بەوەوە دەبینێ
دواتر لە کۆڵانە شینەکانی بەهەشت
چاوی بە کوڕە ناوەنجییەکەی ڕۆشن بێتەوە
دەستی کچە بچکۆڵەکەی بگرێتەوە و
باوەش بە کوڕە هەراشەکەیدا بکاتەوە
کە بۆ گەشتی هیوا چوو و نەگەڕایەوە

دایکم لەگەڵ مردوواندا دەژی
ئەی هاوڕێم
ئەو هەردەم دوعا دەکات



تا بەبێ ئازار
لە کەناری زیندوویییەوە
بپەڕێتەوە بۆ ئەوبەری نەمان
ئەو هەموو ڕۆژێ لەسەر گڵکۆی کۆرپەکانی
چلدانە دەگرێتەوە
بۆ سەلامەتیی ڕۆحی مردووان

وەرە ئەی هاوڕێم
وەرە با پێکەوە سەما بکەین
وەرە با پێکەوە
لەو زەمەنی غەدرەوە
شۆڕبینەوە بۆ ناو نزرگای شێتبوون

بریستڵ، پاییزی ٢٠٠٠

بەسەر زەمینی ڕۆحدا ڕابوردم
لە دوورەوە خۆم بینی
ئاسمانێکی ئاوی پڕ لە وردە ماسی
پەڕیمەوە بەرەو ئەو دیو
ئەو دیوی شتەکان
ئەو دیوی لەش
ئەو دیوی با
لەوێ بە خۆم گەیشتم

فارنهام، ١٧ ی دیسیمبەری ٢٠٠٢







دوێنێ شـەو
شیعـر
مینا کوڕێکی زراڤ
لـە کەناری لـم
بە رووتی راکشـابوو
منیش سـپیتر لـە مـەوجی رۆشـنایی
لەسـەر روویا خۆم هـەڵخسـت
دواتر مـەلائیکەتێ بەلامـدا تێپـەڕی و فـەرمووی
سـەڵەواتت لـێ بێ
ئەی ئەو کەسـەی کە پڕیت لـە فـەزیلـەت[١]

لەندەن، ١٩٩٨

(١) ئەو ڕسـتـەیە لـە تەورات وەرگـیـراوە کـاتێ حـەزرەتی جـبـرایل دەچێـتـە حـزوری حـەزرەتی مـریـەم بۆ ڕاگەیاندنی هـەواڵی لەدایکبوونی مـەسیح.







١

دڵۆپێ سێبەر رژایە بەر پێم
فەزا دابەش بوو
شوێن بوو بەدوو کەرتەوە
سنور رووا
من لەیەک کات لێرەم و لەودیو
بەڵام هەردەم لەگەڵ تۆم



٢

شوێنەکان پڕن لە نادڵنیایی
تەمی بێدەنگی لەسەر روومەتی پێکەوەیی
دەستەکانمان پڕ لە شەونم

٣

تیشک بە ئێمە دەچێ
سیمای پڕە لە گومان
وەکو ئێمە ناسک
وەکو ئێمە بەهێز
هەروەکو ئێمە بە بێدەنگی دەگریت

٤

لە چۆڵاییی دەستەکانت
بێپایان راکشاووم
هێشوویەک جوانی
لەناو کۆشی ژیان

٥

پێکەوەبین یا بەجیا
یەکتری دەنووسینەوە
ئەوی دی کە رابردوو بوو
ئەوی تر کە هەرگیز لە داهاتوودا نابێت

٦

سەدای مەنفا
کە بینین نەیتوانی پێی بگا
وەک نەرمە گیا
لە نێوان پەنجەکانمان ڕووا

٧

سپێدەیەک، نیوەڕۆیەک، یا پاش عەسرانێک
بەبێدەنگی دەکەوین
وەک نووستوو چاو لێک دەنێین
وەک مردوو هەناسە دەدەین

لیل، هاوینی ٢٠٠٢

# دڵنیایی

بۆ ئەو ئازیزانەی دوێنێ «هەبوون»، ئیمڕۆ «نین»، ئەوانەی هەمیشە لە ناومدا دەژین.

چاوم لێتە
پرچە پووشاوییەکەت
هێلانەی کوندەپەپوو
بە کەناری خۆزگەکانماندا گوزەر دەکەی

چاوم لێتە
پەیکەرێکی ئاوریشمیت
دەستت لە کەمەری ئەستێرە و
باڵات لەناو دەشتاییی با
چەند پێپایان راکشاوی!
دەنگت بێڕەنگ و
بێڕەنگیت بێدەنگ
بێدەنگیشت بەرز بەقەد رۆشنایی
لەناو شەلالی خامۆشییەکی شین
نوور دەرژێنێتە بەر پێی دڵنیاییمان
ئێمەش لە چۆلاییی ئێرە
لە ئاسمان رادەمێنین
بە قەراغی خۆماندا تێدەپەڕین
تامی بێدادی بۆ دوور دەبەین



تۆش خەرمانێک لە نادیاریی
لەسەر رووخسارت دەست لە بۆشی دەدەم
ئاه نادیاریت چ حزورێکی دیارە

لەبەر رۆشناییی پیرۆزت
دەچینە ناو ئاوێنەوە
حەقیقەت چاو لێک دەنێ
وەنەوز دەدا ژیری
پۆلی گوناه بەڕەڵلا دەبن
دەشنێیتەوە رابردوو
سڕ دەبێ سات
شین دادەگەڕێ داهاتوو

نهێنییەکان بانگمان دەکەن
بشارەوە لەناو شینایی جەستەت
با تاریکیی شتەکان
نەبنە هێڵی نێوانمان
با هێڵەکان نەبنە سنووری لەبیرکردن

لەپشت سەری تیشک دانیشتم
ئاه چەند گەرمە نزیکبوون
چەند نزیکە پێکەوەبوون
لەناو باوەشی وشە و
ئاوێزانی دڵنیایی

پاریس – هێلمۆند، دیسیمبەری ٢٠٠١





لە چۆڵاییەک
لە ناو بیابانی تەم و
دامێنی تەپۆلکەی با
ژنێک رووی کردە خودا
ژنێکی تەنک  باڵا
رووخسار پڕ لەهێما
دەستەکانی هەڵبڕی و
گوێم لێ بوو دەپاڕایەوە:
«ئەی خودای مەزن
هێزێکم پێ ببەخشە با لە نهێنییەکان نەگەم
چونکە من نامەوێ لەناو رقدا
ژیان لە ئامێز گرم»[٢]

لەندەن، هاوینی ٢٠٠٢

(٢) ئەم شیعرە لە پەراوێزی پەندێکی چینیدا نووسراوە کە دەڵێ: «ئەگەر لە هەموو نادادوەرییەکانی ئەم جیهانە بگەی لەوانەیە لەناو رقدا بمریت».

# ستـرانی ژنێکی سـەربڕاو

پێـشـکـەشــە بە گـیـانی پاکی ئەو ژنانەی بە
بەهانەی شـەرەفەوە کوژران







هێی هێی هێی هێ
سەرگوزەشتەی من
دەشێ سەرگوزەشتەی تۆش بێ

سەرگوزەشتەی من
سەرگوزەشتەی گوڵێک بوو
لە سووچێکی سەر ئەم زەمینە
دەشنایەوە، پێ دەکەنی
لەگەڵ جوانیدا هاودەم بوو



ڕۆژێ بایەک هەڵی کرد
بایەکی بۆر، قورس، چڕنووک درێژ
درێژ درێژ بە قەد باڵای تاوانەکان
تاوانی بوون، تاوانی ژنبوون

هێی هێی هێی هێ
گوڵێکی سپی بووم
لەگەڵ با، لەگەڵ باران
لەگەڵ عەشقدا هاودەم بووم
بای بۆر، قورس، ناگەهان
بە بەرگی پیاوانەوە هات
گرم گرم ئەستێرەکانی شکاند و
کانیەکانی هەڵوەراند
گرم گرم
نزیک بۆوە
بای بۆر، قورس، ناگەهان
بە بەرگی پیاوانەوە هات
نزیک بۆوە
نزیکتر
هات

چڕنووکی چەقۆ ئاسای لە روومەتەکانم گیر کرد
پەپوولەکانمی خنکاند
رۆشنایی سەربڕی و
بە خوێنی ئاڵم
مەرگی ژیانی تۆمار کرد

هێی هێی هێی هێ
سەرگوزەشتەی من
دەشێ سەرگوزەشتەی تۆش بێ

لەندەن، ٨ ی مارتی ٢٠٠٠







دوور
زۆر لە دوور
لە سووچێکی تەنهایی
لەگەڵ وشە خەوتم
کەزیی شیعر چەند درێژە
لەسەر گۆنای وتن !

ئنجا ئەو هاتە گۆ و چرپاندی
زانایی پێچەوانەی نەزانی نییە
بەڵکو فەزایە
بۆ رووانینێکی تر
بۆ سەما کردن لەناو رۆشناییەکی باڵاتر

بریستڵ، زستانی ٢٠٠١

لە کتێبە پیرۆزەکانەوە وشە
لە وشە بریقەدارەکانەوە مانا
لە مانا شاراوەکانەوە دەنگ
دەنگ هەڵی کرد
دەنگی غەیز، دەنگی مەئیوسی غەزو
ئەنفال هەڵی کرد
ئ - ە - ن - ف - ا - ل
ئ - ە - ن - ف - ا - ل

ئـ: ئاگرێکی بێ ئامان
قرچە قرچی رۆحی زارۆک و
هەڵکرووزانی دڵی دایک
زرمەی کەوتنی تەمەنەکان



هـ: هاوارە
هاواری پەوولە
سەد و هەشتا و دوو هەزار پەپوولەی کەسک و
سور و زەرد
لە ناو گەردەلوولی هەڵوەرین و
تۆفانی زەمەن

نـ: نوورە
نوورێکی پێغەمبەرانە
شەڕانگێزانە خشپەی دێ
دێت رۆژەکانمان دەپێچێتەوە
بیابان رادەخات و
تۆزی غەزو دەکاتە چاوی کانییەکان

فـ: فانۆسە
فانۆسی چاوەڕوانی
شین شین دەسووتێ
لە دەستی ژنێکی ئەسحابە ئاسا
بێوەژنێکی شانزە ساڵ
لەسەر کۆسپەی تەنیایی

ا: ئومیدە
ئومێدی گەڕانەوە
بۆ ناو ئاهەنگی رەنگەکان
ئومێدێکی پڕ ئوبهەت

بۆ درەوشانەوە لە ناو تەمەن و
ئاشنابوونەوە بە ساڵە لەدەستچووەکان

ل: لێڵ بوو نیگامان
تەم لوولی داین
بۆ نەخشبوون لەسەر لێواری کتێبە پیرۆزەکان

ئ – ە – ن – ف – ا – ل
ئ – ە – ن – ف – ا – ل
دەنگ هەڵی کرد
دەنگی مەئیوسی غەزو
دەنگی گەردەلوولی سارا و تۆفانی بەرد
دەنگ هەڵی کرد
دەنگی غەور، دەنگی غارەک
ئەنفال هەڵی کرد
ئ – ە – ن – ف – ا – ل

دایکم لەسەر کۆسپەی چاوەڕوانی
ملوانکەی ئومێدی دەهۆنیەوە
کاتێ زرمەی لاشەی کۆرپەکەی
کەوتە ناو کۆش

دەنگ هەڵی کرد
دەنگی غەیز، دەنگی غەزو
غەزوی باخچە، غەزوی رەنگ، غەزوی فڕین



هاوار لە بێدەنگیی چاوەڕوانیی دایکمدا دەباری
کەس ناوێرێ بڵێ (مردن)
ئەو لەسەر کۆسپەی ئومێد
سیانزە ساڵە
فانۆسی چاوەڕوانیی هەڵکردووە و
ملوانکەی بینینەوە
بۆ کۆرپە ناوەنجییەکەی دەهۆنێتەوە
فانۆسی چاوەڕوانی
لەناو کۆڵانە تەنگەکانی هیوا
لە دەستی پەنجا هەزار بێوەژنی ئەسحابە ئاسا
شین شین دەسووتێ
فانۆسی چاوەڕوانی

بریستڵ، ئۆکتۆبەری ٢٠٠٠

لە ناو دەشتاییی بادا
چوارمشقی دانیشتبووم
ئەو بە پەلە خۆی کرد بە ژووردا
بوار نەبوو بۆ هەڵکردنی چرا
لە تاریکیدا یەکتریمان ماچ کرد
تاریکی، تاریکی، تاریکی

ئنجا ئەو دەیووت
«خۆشەویستی پەرامووچەیەکە بەدەم باوە
لە نێوان من و تۆدا دەخولێتەوە
ئاخۆ لەسەر رۆحی کاممان بنیشێتەوە
رۆژێ»



بێدەنگیمان پڕبوو لە سەرسامی
لە چپەی ناگەهان
لە ئارەزووی بەتینی راکردن
رامان کرد رامان کرد
توند رامان کرد
لەپڕ دەرگاکە داخرا
ئەرێ تۆ دەزانی چی رووی دا؟

پرسیارەکانی ئەوسامان
کاڵ کاڵ
لە پەراوێزی ئاوێنەکان
لە نێوان دەستەکانماندا
بۆ چۆرێ قەناعەت حەسرەتیان دەرژت
دەبوایە سەفەری خۆیان دوا بخەن
نەدەکرا وەڵامەکان بەرووتی
لەسەر شەختەی ساڵەکان جێ بهێڵین
ئەی چی بەکات بڵێین
کە لە سەر شانەکانمان
ددانی جیڕ دەکردەوە و قا قا پێ دەکەنی

زەمەن بێ رەحمانە دەخلیسکێ
هەڵکەوت نەبوو

باڵەکانمان نووشتانەوە
کاتێ چراکە داگیرسا
کەشتییەکی چارۆگەدار
لە قەدی تەماشامان کەوتە خوار
دەبوایە سەفەری خۆی دوابخات
ئەو گەشتە قەدەرییە
نەدەبوایە ئاوا بەپەلە بکەوینە ڕێ

چوارمشقی لەناو پانتایی خەون
ئەو بە پەلە خۆی کرد بە ژووردا
بوار نەبوو پەنجەرەکان بکەینەوە
تا پەپوولەکانی شەموەت گۆرانی لێوە بڵێن
شەمشاڵێ نەبوو
بۆ لێدانی ئاوازی لەززەت



بەپەلە
زۆر بەپەلە
زەمەن بێ ڕەحمانە دەخلیسکێ
نەدەکرا پێکەوەیی هەڵگرین
بۆ دوارۆژی سەدەکان
ئەی چی بە ساوا جوانەمەرگەکە بڵێین
کە پێکەوە لە باخچەی
سانت ڤانسنت دوپۆلدا ناشتمان؟
تۆ چوویت گوڵ بکڕیت
کە هاتیەوە سەرجێگاکە خالی
کە هاتمەوە ژوورەکە پڕ بوو لە تارمایی
نا نەدەکرا
بەو ناوەختییە ژووان لەگەڵ ئەو هەمموو مەرگەدا
نەدەکرا

دەبوایە دڵی دوورییەکان نەڕەنجێنین
نووشتەی پیرۆزیش بکەینە
گەردنی نزیکبوونەوەکان
چنگێ جوانیش هەڵگرین
بۆ سبەینێی ڕۆژەکان
بۆ ئەو ساتانەی کە تەنی نۆستالژیا
دێتە ژووانمان
ئێمەش ساویلکانە
لەسەر چڵی زەمەن دیلانێ دەکەین

ئەوسا کە بە ئەسپایی خۆت کرد بە ژووردا
بیرت نەچێ
بە پەپوولەکان بڵێ چاوی عەشقتان ڕۆشن
بە پەنجەرەکانیش بڵێ
خۆشەویستی تەنها لە ئازادیدا خونچە دەگرێ
ئەوسا کە بە ئەسپایی خۆت کرد بە ژووردا
بیرت نەچێ
ساز و شمشاڵێ لەگەڵ خۆت بێنە
با بە ئەندازەی نزیکبوونەوە
سۆزی لەززەت بژەنین
بە فراوانیی سنوورەکانیش
ستران بچڕین



کە گەیشتینە بەردەم دەرگا داخراوەکە
شادە و ئیمانێ بێنە
ئەمە مەرقەدی عەشقە
چارەنووسمان لەناو گۆڕێکی شووشەبەند
چاوی لێک ناوە
لە سەر کێلەکەی هەڵکەنراوە:
«ڕزگاربوون نە لە دەرچوون دایە نە لە مانەوە
سەڵەوات لە دیدارت
ئەی عاشقی پیرۆز»

ئنجا ئەو دەیووت
«خۆشەویستی پەڕامووچەیەکە بەدەم باوە
لە نێوان من و تۆدا دەخولێتەوە
ئاخۆ لەسەر ڕۆحی کاممان بنیشێتەوە ڕۆژێ»

بریستڵ – لەندەن ، پاییزی ٢٠٠١

دەنگێکی بە پەرۆش لە دەرگا تەنهاکەوە پرسی
ئەری بەختەوەریت ؟
...........
نزیک بۆوە
نزیکتر
لە دەرگا نیگەرانەکەوە وتی
ژیان جەنگە
بەختەوەریش ساتە دەبێ بیگری
جوانییە دەبێ بینۆشی
سۆزە دەبێ بەشی کەی
قەناعەتە دەبێ دروستی کەی
بەختەوەری پەیژەیە
وەرە با پێکەوە بە سەریا هەڵگەڕێین
دەنگێکی بەسۆز لە دەرگا نائومێدەکەوە
ئەو وشانەی دووبارە دەکردەوە

بریستڵ ، بەهاری ٢٠٠١

١

دابەش دەبم
لە نێوان وشە و رەنگ
سیمام لە رەنگدا بەرجەستە دەبێ
حەقیقەتم لە وشە



٢

هێڵەکان با – ن
با – ن هێڵەکان
لەگەڵیان بەرەو تۆ هەڵدەکەم
واتە بەرەو خۆم

٣

پەنجەی رۆژەکان
سپیایەتیمان لێڵ دەکەن
تەنها لەناو یەکتریدا
رۆشناییمان
نەخش دەبێت

٤

لەناو یەکدا دەتوێینەوە
ئاوەژوو دەبین وەک سۆفی
لێژ دەبینەوە بۆ ناو ناسینی نەناسراو

٥

دەمێکە
لەگەڵ تۆم
واتە
لەگەڵ خۆم

٦

لە فەزای پێکەوەبیمان
پەنجە دەڕوێن
پەنجەی رەنگ
تەنها ئەو پەنجانە دەتوانن
سنووری نێوان من و تۆ بکێشن

لەندەن، هاوینی ١٩٩٨

* ئەم کورتە شیعرانە لەسەر چەند تابلۆیەکی هونەرمەند رێبوار سەعید نووسراون لە چوارچێوەی پرۆژەیەکی هونەری بەناوی (وشە و ڕەنگ).

من تیشکم
زایەڵەم لە بەرزاییییەوە دەترازێ، دەڕژێمە سەر
روخسارتان، لە ناو چاوتاندا رەنگ دەدەمەوە،
بەردتان رۆشن دەکەمەوە، بەردە
سەرەتاییییەکانتان، دەڕژێمە زەمەنتان و خوڕڕەم
دێ، وشکاییتان سەرچاوە نادیارەکانی
دەپێچێتەوە، شەڵاڵێکی زێڕەوشان روو دەکەمە
پانتاییتان، لە ژێر برژانگەکانتان گۆرانی دەڵێم،
لە کەنارتان رادەکشێم، لەشتان شێوەی رووبار
وەردەگرێ، لە سەر پێستتان خۆم هەڵدەخەم
'' سۆزی هەتاو لەسەر گژوگیای خەوتوو''



تیشکتانم...
سیمام باڵ دەگرێ، بەرزاییییەکانی بێدەنگیتان
تەی دەکەم، شەوق دەبارێنمە سەر زەنگوڵی
گوتن، نیگایەک دەپشکوێ، بینین باوەش
دەکاتەوە، سپیایەتی دەڕژێتە ناو شینایییتان،
بەردەکان دەبنە پەلکەزێڕینە، بەردە
سەرەتاییەکانتان، دەڕژێمە زەمەنتان و خوڕڕەم
دێ، غوبارتان خونچە دەگرێ، ئاسمانتان
چارۆگەی شەرم دەگرێتەوە، لە ژێر چڵی
گەرماییمدا پیت پێدەگرێ
ئاوازی رەنگ لە بەردەرگای تەمەن

تیشکتانم...

دەتکێمە سەر جەستەی ساڵەکانتان، نوور روو دەکەمە بەرپێی پیریتان، منداڵیتان رادەژێنم، دەست دەخەمە سەر سنگی شەوەکانتان، ناولەپم گڕ دەگرێ، بسکی درێژی خەونەکانتان لەسەر گۆنای سەردەم، دەڕژێمە زەمەنتان و خوڕڕەم دێ، بەردەکان دەتریقێنەوە، بەردە سەرەتاییەکانتان، زەمەن باوەش دەکاتەوە، زەمبیلێ وشەم پێیە، دێم و ملوانکەی دوارۆژ دەکەمە گەردنی ئێستاتان، گەڵایەکی نارنجی لەسەر پەرچەمی هەور، بەرز بەرز هەڵدەکەم دەدرەوشێنەوە لەژێر تریفەی پەیڤم



تیشکتانم...

ناولەپی ئەستێرە جێ نزرگەمە و لە قووڵاییەکانی فڕینەوە هەڵدەکەم، چەشنی هوما دەنیشمە سەرشانی تەماشاتان، ناوچەوانتان پێروو دەگرێ، رووخسارتان وەک چرا دادەگیرسێ، دەڕژێمە زەمەنتان و خوڕڕەم دێ، بەردەکانتان دەبنە شینەشاهۆ، بەردە سەرەتاییەکانتان، دەدەنە شەقەی باڵ، ئاسمانتان لاپەڕەکانی هەڵدەداتەوە، دڵۆپێ شینایی دەتکێتە بەرپێتان، دەستنوێژ هەڵگرن پەریەک دێتە حزورتان، چەشنی پەڕاموووچەیەکی کەسک لە بناری با، دێم و دەستی موبارەکی بە پشتتاندا دێنم، رۆح شاگەشکە دەبێ، جەستەتان نووری لێ هەڵدەستێ، جوانی جریوەی دێ لەژێر پڕشنگی پیرۆزییم
هۆ هۆزە پەرەوازەکەم.

بریستڵ ، زستانی ۲۰۰۲

من کۆنترم لە ژیان
کۆنترم لەو بایەی کە لە ڕۆژهەڵاتی جەستەم
هەڵی کرد
بەلەمێکی شین بەرەو باکورم دەبات
من کۆنترم لە ئاوابوون
من کۆنترم لە کۆنبوون



لە باشوورمدا مەودایەکی فراوان
لە ڕۆژئاوامدا هێمایەکی هاوسەنگ
من ئاهەنگی ئێوارانم و
کۆنترم لە درەختی ژیان
کۆنتر لەو چرایەی لە دوورگەکانم داگیرسان
کۆنتر لەو ئافوورە کریستاڵییەی لە پانتاییمدا
هەڵدەچێ

من کۆنم
کۆنترم لە سپیایەتی بەفر و
تەڕایی هەتاو
من کۆنم
کۆنتر لە گردە سوورەکانی مەریخ و
ئاگری بورکانەکان
من کۆنترم لە خەونە سەوزەکانی تاشەبەرد و
دڵنیایی کەنارەکان
من کۆنترم لە سووری دەریا و
هەڵچوونی شەپۆڵەکان
من کۆنترم لە دوێنێ و
نوێترم لە سبەینێی ڕۆژەکان

من بڵندم
بڵندتر لە لووتکەکانی وتن و
باڵای جوانی
بڵندترم لە پیری و
باوەشی گەرمی ئەستێرەکان
من بڵندترم لە ڕۆشنایی و
تەماشای شینی باڵندەکان

من پانتاییەکم
لە پێکەنین
لە گریان
لە هەناسە
من پێ دەکەنم
من دەگریم
من سەما دەکەم

من گەورەترم لە گەورەبوون
نەمرترم لە مردن
من دەژیم

فەرەنسا، شوباتی ٢٠٠٤

گەڵایەکی نارنجی
لەسەر باڵە سپییەکانی با کۆچی کرد
ئینجا دەنگێک لە هەوادا هەڵی کرد:

مەنفا بەڵێنی خاکێکی گوڵشەن و
هۆزێکی ژیرم پێ دەدا
کە من تیایدا خۆم بم و
ئازادیش هاوڕێی مرۆڤ

فەڕەنسا، هاوینی ۲۰۰۳







لە سووچێکی شەودا
زەمین سەمای دەکرد و
ئێمەش زارۆکی مەوجێ بووین
لە مەوجە دێرینەکان

شار پانتاییەکی شین بوو
پڕ لە وردە ئەستێرە
گەڕەک دۆڵێکی درەوشاوە
کۆڵانەکان تەلیسمێ بوون لە سەدا
سەدای سەوزی دەهۆڵژەنەکانی سەحەر
کە بەر رووخسارمان دەکەوت و
ئاوێتەی رەنگ و ریتمی دەکردین



زارۆکی مەوجێ بووین لە مەوجەکانی بەرائەت
لەگەڵ یەکەمین ژەنین
تێکەڵ بە ئۆرکێسترای سەحەر دەبووین و
پاشێومان دەکرد
بە چنگێ ئەفسوون و
هێشوویەک لە بۆنی بخوور
لە گوێسوانەی سەربانە قوڕینەکانەوە
خۆمان شۆڕ دەکردەوە
بۆ بینینی رەنگی ژەنین و
چنینەوەی نەسیمی تەماشای دەهۆڵژەن
زارۆکی مەوجێکی دیرێن بووین
پەنجەکانمان بۆنی ریتمی لێ دەهات و
ترپەی دڵیشمان خوداوەندانە
چەشنی ئاوازی دەهۆڵژەن
تێکەڵ بەو پانتاییە بلورینە دەبوو
پانتایی سەحەرەکانی رەمەزان

سپێدانیش کە لە خەو رادەبووین
پیاڵەیەک لە سۆزی نەشکاوی دایک
فتاری پێ دەکردینەوە و
چوون پەپوولەی هارمۆنیا
لە سەر چڵی رۆژەکان بەرز بەرز دەفڕینەوە

فەرەنسا، پاییزی ٢٠٠٣





تەنها
وەک هەموو ئێوارەیەک
کۆنە کتێبێک لەژێر هەنگڵ
بە کەناری لواغدا رادەبوورم

ئنجا من گوێم لێیانە و دەڵێن
ئەمە زەمەنێکی وشکە
لواغ وەک جاران ناتریقێتەوە و
گوڵی ئاوریشمی نادا لە پەرچەمی با



لواغ باڵای وەرزێکی دێرینە و
ساوایانە سەردەکا

پۆلێ مناڵی کەسک و سوور
تەنکە بەردی نەرم دەگرنە رووخساری لواغ
بازنە ئاوییەکان
لۆچی تەماشای
پیرێژنە سەر رووتاوەکانی ئێوارەکانی ئەم ناوەن
کە لەناو بۆشاییی رۆژەکان دادەنیشن و
خەون بە سپێدەکانی تەمەنەوە دەبینن

لواغ توولە رێیەکی نارنجییە و
بە هێواشی دەکشێ بەرەو دۆڵێکی خۆڵەمێشی

سەرخۆشەکان
گەردێکی وەنەوشەیین لەسەر گۆنای ساڵەکان
قوتووە بیرە بەتاڵەکان لە کەمەری لواغدا
پشتێنی زێرینی تەنهایین

لواغ هۆڕەی دەشتێکی سپیواژە
بە بێ ئامان هەڵدەکا

ئنجا ئەوان بەردەوام دەڵێن
ئەمە زەمەنێکی وشکە
نۆرەسەکان ئۆپێرای فڕین ناگێڕن
تاشەبەردەکان چیتر خەون نابینن
لواغ پاش عەسرانی تەمەنە و
بە دەم غەیبەوە رێدەکا



من بەردەوام گوێم لێیانە و دەڵێن
ئەمە زەمەنێکی وشکە
سەرنجە شین و بێدادەکانی لواغ
هێمای تەنکی موسافیرێکی بێ ناوونیشانە
کە هەموو پاش عەسرانێک
کۆنە کتێبێک لەژێر هەنگڵ
دێت و دەڵێ
ئێوارەت باش لواغ و
ئاوا دەبێ

تووغ، هاوینی ١٩٩٠

* لواغ ناوی ڕووبارێکی بەناوبانگە لە فەرەنسا

لەسەر پانتایی نادیاریت
پەنجەرەیەک کرایەوە
پەنجەرەیەک بە ئەندازەی شادبوونەوە بە یەکتری
پەنجەرەیەک بە ئەندازەی دیدارێک
لەگەڵ جاران و
لێژبوونەوە بۆ ناو عیرفانی حیکایەتەکانی نەنکم



ژیان دەشێ دانیشتنێکی وەنەوشەیی
خوشک و برا بێت
لەناو ژووری سپیی وشە و
بەر ئاگردانی حیکمەتەکانی نەنکم

ئینجا ئەو دەیوت
ژیان دەشێ چاوەڕوانییەکی شین بێت
بۆ دیداری عەشقێ یا بۆ لێکدابڕان
چاوەڕوانیی لەدایکبوونی رۆئیایەک
یا تێکەڵبوون بە غوبار
ژیان دەشێ چاوەڕوانییەکی شین بێت
چاوەڕوانیی ونکردنی هەمیشەیی یەکێک و
سەرەتای کۆتاییەکان
کۆتایی پێکەوەیی و
سەرەتای خۆڕاهێنان

ژیان دەشێ تەنها خۆڕاهێنان بێت
خۆڕاهێنان بە پێکەوەیی
یا بە رووبەری دوورییەکان
خۆڕاهێنان بە نادیاری و
بە سیمای ساردی ساڵەکان
خۆڕاهێنان بە چاوەڕوانییەکی دیکە
چاوەڕوانیی کردنەوەی پەنجەرەیەک
بە ئەندازەی بینینەوە و
سپاردنی کلیلێ لەگەڵ قەناعەتێکی رووت
بۆ قفڵدانی دەرگاکان



دەرگایەک لەسەر دووری
یەکێ لەسەر درەشانەوەی ساتەکان
دەرگایێ لەسەر عەشق
یەکێ لەسەر جوانەمەرگیی روئیاکان
دەرگایێ لەسەر ژوورە سپییەکانی وشە و
یەکێ لەسەر هەبوو نەبووەکانی نەنکم
دەرگایێ لەسەر هەیوانی ئەو کۆشکەی
کە من و تۆ پێکەوە پێیدا تێپەڕین
دەرگایەک لەسەر ئەو دەرگایەی
کە لێی هاتینە ژوورەوە و
یەکێ لەسەر ئەبەدییەتی پێوەندییەکان

ئینجا نەنە ئامینم دەیوت
ژیان دەشێ تەنها دەرگایەک بێت
بۆ گوزەرکردن بەرەو پانتایی ئێرە و
چوونەدەرەوە لە دەرگایەکی دیکە
کە بە هەمیشەیی دادەخرێت

فەرەنسا، پاییزی ٢٠٠٣





# پێڕست


دوعاکانی دایکم ... 7
ڕۆحانییەت ... 15
پاسیۆن ... 19
ستایش ... 23
دڵنیایی ... 29
پاڕانەوە ... 33
سترانی ژنێکی سەربڕاو ... 37
بێدەنگی ... 43
غەزو ... 47
گۆڕێکی شووشەبەند ... 53
دەنگ ... 61
پەیڤەکانی خۆشەویستی ... 65
گۆرانییەک بۆ هۆزەکەم ... 71
سەمفۆنیای ژیان ... 77
ئەندێشە ... 83
دەهۆڵژەنەکانی سەحەر ... 87
پاش عەسرانی لواغ ... 91
حیکایەتەکانی نەنکم ... 97




**زۆربەی ئەم شیعرانە لە ڕۆژنامە و کۆوار و سایتە کوردییەکاندا بڵاوکراونەتەوە و لە کۆڕە شیعرییەکاندا بەکوردی و ئینگلیزی و فەرەنسی خوێندراونەتەوە**